

# شێوە و ڕووخسارە جوان و گەشاوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ

## هاوشێوەی مانگی چواردە

وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين

ماموستا مەبەست کاژاوی



# شێوە و ڕووخسارە جوان و گەشاوەکەی

# پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

# هاوشێوەی مانگی چواردە

مامۆستا مەبەست کاژاوی

١٤٤٤ هـ

١٢ ربيع الأول

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على إمام المرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين. أما بعد:

پێغەمبەری خوا ﷺ باڵا درێژێکی ئاشکرا و دیار نەبوو، وە کورتیش نەبوو.

پێغەمبەر ﷺ لاشەیەکی جوانی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ لاشەی گۆشتن بوو بەڵام قەڵەو نەبوو، چوارشانە بوو، نێوانی شانەکانی لێک دوور بوو.

پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی پێستی سپیەکی تێکەڵ بە سوور بوو، سپیەکی سووورباو بوو، ڕووخساری مەیلە و بازنەیی بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەکانی زۆر ڕەش بوون. برژانگی درێژ بوون، برۆکانی باریک ودرێژ بوون بەڵام پێکەوە نەلکابوون، لوتی مەیلە و درێژ بوو، دەبریقایەوە، ڕوومەتەکانی تەخت بوو، دەمی

فراوان وگەورە بوو، ددانەکانی لێکتر دوور و شاش بوون.

پێغەمبەر ﷺ قژی نە لوول بوو، نەخاو بوو هەندێک جار چەوری دەکرد. قژێکی درێژی هەبوو هەتاکو نەرمایی گوێیەکانی، هەندێک کات دەگەیشتە سەر هەردوو شانەکانی. هیچ کەسێک و هیچ شتێک لەو جوانتر نەبوو.

پێغەمبەر ﷺ دەست و پێیەکانی پتەوبوون، سەری تەواو و گەورە بوو، نیوچاوانی پان بوو، جومگەکانی گەورە بوو، مووی سنگی باریک ودرێژ بوو تا ناوکی.

پێغەمبەر ﷺ دەست وقاچەکانی درێژ بوون، ناولەپی دەستی پان بوو.

پێغەمبەر ﷺ ڕیشی چڕ و پڕ بوو، لە سەر وڕیشی چواردە تاڵە مووی سپی هەبوون ئەگەر چەور بکرایە سپێتیەکەی نەدەبینرا.

پێغەمبەر ﷺ لە نێوان هەردوو شانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو پارچەیەک گۆشتی بەرز بووە بوو وەک هێلکەی کەو یان کۆتر وا بوو کۆمەڵێک مووی لەسەر کۆببوویەوە.

پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەڕۆیشت بەرەو پێشەوە دەچەمایەوە. ئەگەر ئاوڕی بدایەتەوە بەتەواوی خۆی دەسوڕاند، چاوی نزم دەکردەوە، سەرنجدان و تەماشاکردنی بۆ زەوی زیاتر بوو.

خۆشەویسترین پۆشاک لای پێغەبەری خوا ﷺ دشداشە وکراسی درێژ بوو، سەرقۆڵەکەی تا مەچەکی دەستی دەهات، حەزی لە پۆشاکی لۆلە وکەتان بوو.

ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو دروستکراوبوو، مۆری نامەکانی پێدەکرد، هەڵکەندرا بوو، چەند نووسینێک لەسەری نوسرابوو، نووسینەکەیش بەم شێوەیە بوو:

دێڕێک نووسرا بوو "محمد" دێڕێک نووسرا بوو "رسول" دێڕێک نووسرا بوو "الله".

پێغەمبەر ﷺ بەشێوەیەکی ڕوون وئاشکرا قسەکانی دەکرد، ووشەی کورت و واتاداری بەکار دەهێنا، قسەشیرین بوو، قسەی ڕەق نەبوو.

پێغەمبەر ﷺ دەنگێکی بەرزی پیاوانەی هەبووە بە هێواشی قسەی دەکرد و قسەکانی نێوانی هەبوو بۆ ئەوەی هەموو کەسێک لێی تێبگات، دەنگێکی زۆرخۆشی هەبووە و سەدای تێدا بوو، پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بەدەنگی بەرز پێنەدەکەنی تەنها زەردەخەنەی دەکرد و هەمیشە دەم بە خەندە بوو، گاڵتە وسوعبەتی دەکرد بەڵام گاڵتەکانی دوور بوو لە قسەی ناراست.

محمد رسول الله
والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم